زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# خوا بەسە شاهێد بێ







المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

نـــــــــاوی كتێـــــــــب: زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ): خوا بەسە شاهێد بێ

نـــــووسیـنـــــــــــی: شادی فقیە

وەرگێـــــرانـــــــــی: سەردار ڕەزا

پێداچوونەوەو هەڵەچنی: محەمەد مێرگەیی

نەخشەسازی نـــاوەوە: محمد علی احمد

ســــــاڵی چــــــاپ: ٢٠١٠ ز

شـــوێـنـی چـــــاپ: بەیروت ـ لوبنان

ژمــــــارەی ســپـــــاردن: (١١٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ كتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

زنجیرەی

جوانترین چیرۆك

لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# خوا بەسە شاهێد بێ



**نووسینی**

شادی فقیه

**وەرگێڕانی**

سەردار ڕەزا


المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

نارین



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

لەو شەوە بەهارەیدا سروەی باکەی بە نەرمی یاری لەگەڵ گەڵای درەختەکاندا دەکرد.

فاتیمە: ئەی ئیبراهیم ئەو چیرۆکە جوانە چییە کە دەیخوێنیتەوە؟

ئیبراهیم: ئەوە چیرۆکی ...

فاتیمە: ئەوە لەکوێ دەستت کەوت.

ئیبراهیم: ئەوە لە ئەحمەدی هاوڕێمم خواست.

فاتیمە: ئایا دەتوانی بەیانی بیدەی بە منیش بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکانمدا بیخوێنمەوە.

ئیبڕاهیم: ئا...ئا.. فاتیمە کارێکی ئاساییە. پێت دەدەم، بیبە.

فاتیمە: ئەی تۆ کەی دەیگەڕێنیتەوە بۆ ئەحمەد؟
ئیبراهیم: ئەو داوای لێکردم کە بەیانی بۆی بگەڕێنمەوە.
فاتیمە: ئەی ئەگەر ئەو بەیانی دەیەوێتەوە ئیتر چۆن دەتوانی بیدەی بە من.
ئیبراهیم: گرنگ نیە، ئەحمەد هاوڕێی خۆمە، گوێی مەدەرێ.
فاتیمە: ئیبراهیم! ئەی نازانی ئەوە ئەمانەتەو پێویستە ئەمانەت لەو کاتەدا بیگەڕێنیتەوە کە لەسەری ڕێکەوتوونو کاتەکەیتان دیاری کردووە.

ئیبراهیم: ئەریٚ وەڵا ئەوا باوکم هات...

ئیبراهیم و فاتیمە: سڵاوی خوات لیٚبیٚت بابە گیان.

باوك: سڵاو لە ئیٚوەش ئازیزەکانم.

فاتیمە: بابە گیان ڕای تۆ چۆنە ئەگەر لەبارەی گەڕانەوەی ئەمانەتەوە هەواڵمان بدەیتیٚ.

باوك: (بەزەردەخەنەوە) لەبەر ئەوەی ئیٚوە قسە لەسەر گەڕانەوەی ئەمانەت دەکەن، ئەوا چیرۆکیٚکتان بۆ دەگیٚڕمەوە، کە پیٚغەمبەری خواﷺ بۆ موسڵمانەکانی دەوری خۆی گیٚڕاویەتەوە.

لەزەمانی زوودا، لە زەمانی بەنی ئیسرائیلدا ئەوانەی کە ئیماندار بوون، پیاوچاکێك هەبوو، کە کاری بازرگانی دەکرد.

ڕۆژێکیان ئەو پیاوە پێویستی بە هەندێ پارە هەبوو تا کەلوپەلی بازرگانی پێ بکڕێت، بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ لای پیاوێك، کە ماڵی لە دەوروبەری شارەکەدا بوو، بۆ داوای پارە.

بازرگانە پیاوچاکەکە: سڵاوی خوات لێبێت براکەم.

پیاوەکە: سڵاوی خوا لە تۆش.

بازرگانە پیاوچاکەکە: بۆ پێویستییەك هاتووم بۆ لات.

ئەوی تر: یاخوا بەخێر بێی، چیت دەوێت بەسەرچاو.

بازرگانە چاکەکە: هاتووم هەندێ پارەم بە قەرز بدەیتێ کە بۆ بازرگانی و سەفەرەکەم بەکاری بێنم.

ئەوەی تریان: زۆر چاکە هەزار دینارت دەدەمێ.

بازرگانەکە: کاتێکم بۆ دیاری بکە، تا بۆتی بێنمەوە.

ئەوی تر: چ کاتێ بۆت گونجا خۆت کاتەکەی دیاری بکە.

باوك: بازرگانەکە کاتێکی گونجاوی دیاری کرد بۆ گەڕانەوەی پارەکە.

پیاوەکە پرسیاری لێ کرد...

پیاوەکە: یەك شت ماوە.

بازرگانەکە: ئەو شتە چییە؟

پیاوەکە: چەند کەسێك بێنە، تا بەدیارەوەبن و شاهێد بن بەسەر قەرزپێدانەکەوە.

بازرگانەکە: جا خۆ ئێستا من زۆرم پەلەیەو هاکا کەشتییەکە بەناو دەریادا دەستی کردە ڕۆیشتن، من ئەوندەت پێ دەڵێم: بەسە کە خوای پەروەردگار بەدیارمانەوەیە.

پیاوەکە: راستت کرد خوای پەروەردگار بەسە بەدیارمانەوە بێ و لەنێوانماندا بێت، کەواتە کەفیلێك بێنە، تا کەفیلیت بکات بۆ دانەوەی پارەکە.

بازرگانەکە: خوای پەروەردگار بەسە کەفیل بێت.

**باوك**: لەدوای ئەوەی هەردووکیان ڕێکەوتن و خوای پەروەردگار ئاگاداری قەرزدانەکەو دانانی کاتی گەڕانەوەی قەرزەکە بوو، بازرگانەکە ڕۆیشت بۆ کاری خۆی.

لەدوای ئەوەی خوای پەروەردگار بازرگانەکەی سەرخست

لە گەشتەکەیداو پیت و بەرەکەتی خستە بازرگانییەکەوە، کاتی گەڕانەوەی قەرزەکە هات، بازرگانەکە پەلەی کرد بۆ ئەوەی خێرا بگاتە کەشتییەکەو بە کەشتییەکە بگەڕێتەوە بۆ ئەو لادێیەی خاوەن قەرزەکەی لێ دەژی.

کاتێ بازرگانەکە گەیشتە بەندەرەکە تووشی کتوپڕییەك بوو لەبەرئەوەی کەشتییەکە بەهۆی گێژەڵوکەو بای بەهێزەوە وەرگەڕابوو، بازرگانەکە هەوڵی زۆری دا کەشتییەك بدۆزێتەوە کە سەفەر بکات لەناو ئەو گێژەڵوکەدا، بەڵام بێ سوود بوو.

بازرگانە پیاوچاکەکە: ئای... خوایە گیان چی بکەم، وا کاتی دانەوەی قەرزەکە هاتووەو هۆکارێکیش نابینم کە بەهۆیەوە پارەکە بگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکەی، خواشم کردۆتە شاهێد لەسەر کاتی دانەوەی قەرزەکە.

باوك: بازرگانەکە ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە، دوایی پارچەیەك تەختەی هێناو ناوەکەی هەڵکۆڵی و هەزار دینارەکەو نامەیەکی زانیاری دارو ناونیشانی خاوەنی قەرزەکەی تێکردو سەر قەپاغی تەختەکەی نایەوەو ئەمجا بەرەو دەریا شەپۆلاوییەکە ڕۆیشت.

وەستاو گوتی:

**پیاو چاکەکە**: ئەی پەروەردگارا خۆت چاك دەزانی کە من بڕی هەزاردینارم لەو بەندەیەی خۆت وەرگرتووە، داوای کەفیلی لێکردم، منیش پێم گوت: خوای پەروەردگار بەسە کەفیل بێت پێت ڕازی بوو، داوای شایەتی کرد، پێم گوت: خوا بەسە شاهێد بێت پێت ڕازی بوو، خۆت ئاگاداری کە هەوڵمدا تا کەشتییەك بدۆزمەوە، تاکو پارەی قەرزەکەی بۆ بنێرمەوە، بەڵام دەستم نەکەوت، من ئەم پارەیە دەدەمە دەستی تۆ، ئەی پەروەردگارم ئەی لە هەموو کەسێ بەسۆزو بە بەزەیی تر، تا بیگەیەنیتەوە دەستی خاوەنی.

**باوك**: پاشان بازرگانەکە، پارچە تەختەکەی هەڵدایە ناو دەریاکەوە، تەختە کەوتە ناو ئاوو بەر شەپۆلەکانەوەو ئاوەکە بردی، پاشان ڕۆیشت، تا کەشتییەکی دەستکەوێ کە پێی بڕواتەوە، بەڵام بێ سوود بوو.

**ئیبراهیم**: ئەی باشە پیاوەکەی تر چی کرد؟

باوك: ئەو پیاوەی کە خاوەنی قەرزەکە بوو ڕۆیشت بۆ لای دەریاکەو چاوەڕوانی هاتنی کەشتی دەکرد کە بازرگانەکەی تیا بێتو پارەکەی بۆ هێنابێتەوە.

پیاوەکە: وا کاتی دانەوەی قەرزەکە نزیك بوویەوە، بەڵکو بازرگانەکە لە کەشتییەکدا بێتەوە، کەواتە با بچم بۆ قەراغی دەریاکەو چاوەڕوانی بکەم.

باوك: لەکاتێکدا پیاوەکە لەسەر قەراغی دەریاکە چاوەڕوانی گەیشتنی بازرگانەکەی دەکرد، پارچەیەك تەختەی بینی بەسەر ڕووی ئاوەکەوە.

پیاوەکە: با ئەو تەختەیە بگرمەوەو بیبەمەوە بۆ هاوسەرەکەم، تا لەگەڵ تەختە کۆکراوەکانی تردا داینێ.

باوك: پیاوەكە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان، ژنەكەی لێی پرسی: ئەوە چییە بۆت هێناوینەتەوە؟

پیاوەكە: لەكاتێكدا لە قەراغی دەریاكەدا چاوەڕوانی بازرگانەكەم دەكرد كە قەرزەكەی لێكردووم، كاتێ كە نەهات، ئەو تەختەیەم بینی وا هێناومەتەوە، تاكو بۆ سوتاندن بەكاری بێنی.

باوك: كاتێ تەختەكەیان شكاند پارەو نامەكەیان تیادا دۆزیەوە.

پیاوەكە: ئای خوایە گیان ئەوە چییە؟ خۆ ئەوە پارەیەو نامەیەكیشی تیایە كە لەو بازرگانەكەوە نێرراوە كە قەرزەكەی لێكردووم، پاكو بێگەری بۆ خوایە.

فاتیمە: لەڕاستیدا هەروایە بابە گیان، پاكو بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار، بڕوانە چۆن خوایە گیان ئەو پارەیەی گەیاندەوە دەستی پیاوەكە.

ئیبراهیم: ئەی دوایی چی ڕوویدا بابە گیان؟

**باوك**: دوایی بازرگانەکە گەڕایەوە بۆ لای پیاوەکەو بڕی هەزار دیناری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو نەوەك ئەو هەزار دینارە نەگەیشتبێ.

**بازرگانەکە**: براکەم سڵاوی خوات لێبێت، تکات لێدەکەم لێم ببوورە، زۆر هەوڵمدا قەرزەکەت لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا بۆ بگەڕێنمەوە، بەڵام کەشتییەکم دەست نەکەوت کە پێی بێنمەوە بۆ لات، دەفەرموو ئەوە هەزار دینارەکەتە...

**پیاوەکە**: ئایا هیچ شتێکت بۆ گێڕاومەتەوە؟

**بازرگانەکە**: لەڕاستیدا من لەگەڵ نامەیەکدا هەزار دینارم بۆ ناردیتەوە لەگەڵ ئەو خوایەدا کە بووە شاهێدو کەفیل لەنێوانماندا...

**پیاوەکە**: خوای پەروەردگار تەختەکەی گەیاندۆتەوەو لەجیاتی تۆ قەرزەکەی دایەوە.

**بازرگانەکە**: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەو کەسانە نائومێد ناکات کە بانگی دەکەن و نزاو پاڕانەوەی لێدەکەن.

باوك: بازرگانەكە بەدڵخۆشییەوە ڕۆیشتە دەرەوە كە خوای پەروەردگار قەرزەكەی بۆ دایەوە.

ئیبراهیم: بابە گیان منیش بەیانی چیرۆكەكە دەگێڕمەوە بۆ ئەحمەدی هاوڕێم، لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا.

باوك: ئافەریین ئیبراهیم.

منداڵەكان: بابە گیان سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەو چیرۆكە جوانە كە بۆت گێڕاینەوە.

عن رسول الله ﷺ أنه قال:

((إنَّ رجلاً من بني إسرائيل سألَ بعضَ بني إسرائيل أن يُسلِّفه ألفَ دينارٍ فقال: ائتني بالشهداءِ أُشْهدهُمْ. فقال: كفى بالله شهيداً. قال: فأْتني بالكفيل. قال: كفى بالله كفيلاً.

قال: صدقْتَ.

فدفعَها إليه إلى أجل مسمى، فخرج في البحر فقضى حاجتَه، ثم التمسَ مركِباً يركبُها يقدمُ عليه للأجل الذي أجَّلَه فلم يَجِدْ مركبا، فأخذَ خشبةً فنقرَها، فأدخلَ فيها ألفَ دينارٍ، وصحيفةً منه إلى صاحبِهِ، ثم زجَّجَ موضعَها، ثم أتى بها إلى البحرِ، فقالَ: اللهمَّ إنك تعلمُ أني تسلّفتُ فلاناً ألفَ دينارٍ، فسألَني كفيلاً، فقلتُ: كفى بالله وكيلاً، فرضيَ بك، وإني جهدْتُ أَنْ أجدَ مركباً أبعثُ إليه الذي له فلَمْ أجدْ، وإني أستودعُكها.

فرمى بها الى البحرِ، حتى ولِجْت فيه، ثم انصرفَ، وهو في ذلك يلتمسُ، مَركباً يخرج إلى بلدهِ،فخرجَ الرجلُ الذي كانَ أسلفَه، ينظرُ لعل مركِباً قد جاءَ يخرج إلى بلدهِ، فخرجَ الرجلُ الذي كان أسلفَه، ينظرُ لعل مركِباً قد جاء بمالِه، فإذا بالخشبةِ التي فيها المالُ، فأخذَها لأهلِه حطباً، فلما نشرَها وجدَ المالَ والصحيفةَ،ثم قَدِمَ الذي كانَ أسلفَه، فأتى بالألف دينار، وقالَ: واللهِ، مازلتُ جاهِداً في طلبِ مركبٍ لآتيكَ بمالِكَ، فما وجدتُ مركِباً قبلَ الذي أتيتُ فيه. قال: هل كُنْتُ بعثتَ إليَّ شيئاً؟ قال: أخبرُك أني لم أجدْ مركباً قبلَ الذي جئتُ فيه. قال: فإن الله قد أدَّى عنك الذي بعثتَ في الخشبةِ، فانصرِفْ بالألفِ دينار راشداً)).

بوخاری گێڕاویەتیەوە(٢٢٩١).